حكومەتی هەرێمی كوردستان – عیراق

وەزارەتی پەروەردە

بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەكان

# خوێندنەوەی كوردی

## بۆ

## پۆلی دووەمی بنەڕەتی

دانانی

لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

بژاركردنی

سادق ئەحمد عوسمان روستایی

خسرۆ علی حەسەن          ئیسماعیل محەمەد عەبدوڵا

نەمام جلال رشید

چاپی هەشتەم          ٢٧١٥ كوردی          ٢٠١٥ زایینی          ١٤٣٦ كۆچی

# ساڵی نوێمان پیرۆزبێ



دەرچـــووی پۆلی یەکەمم
وا لـــە پـــۆلی دووەمـــــم
یـــاخوا پـیرۆزبێ لێمــان
خوێنــدنی ساڵی نوێمان

مــن قـوتابییەکی وریـام
گوێ ڕایـــەڵی مامۆستام
قـوتابخانەم خـــۆشدەوێ
چونـکە دڵ تیـا دەسرەوێ

کـەلوپـــەلی خـــاوێنـــم
هیچ کـــات نـایانزاکێنم
هــــەر بــژی قوتابـخانە
کـە مـەڵبـەندی ژیـــانە

بـــژی مامۆستـاکانـــم
هـاوڕێ زیـــرەکـــەکانم

(( لەیلا مستەفا ))

## واتای وشەکان:

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| وشە | : | پەیڤ |
| وریا | : | هۆشیار، هشیار |
| گوێ ڕایەڵ | : | گوهدار |
| دەسرەوێ | : | دەحەوێتەوە |
| نایان ژاکێنم | : | نایان گەچڵێنم ، تێکیان نادەم |

# ڕاهێنان (١)

قوتابییانی خۆشەویست، ئەم وشانەی خوارەوە بە پیتێکی گونجاو تەواو بکە:

| ئـ | ب | پ | ت |
| --- | --- | --- | --- |
| .... او | کەڵەبا... | قا.... | پە.... |
|  |  |  |  |

| ج | چ | ح | خ |
| --- | --- | --- | --- |
| سا ..... | قا ..... | تیمسا ..... | شا ..... |
|  |  |  |  |

د

.....ەرزی



ر

که .....



ڕ

بازا .....



ز

بـ ....ن



ژ

...یشک



س

پا ....



ش

ڕه ....



ع

با ....






| غ | ف | ڤ | ق |
| --- | --- | --- | --- |
| قـ.... | كه ..... | دا ..... | لا .... |
|  |  |  |  |

| ک | گ | ل | ڵ |
| --- | --- | --- | --- |
| مريش .... | ڕه ..... | مه..... | مندا .... |
|  |  |  |  |

م
ده ....

هـ
.....ەرمێ

ا
مـ...ر

ە
بـ ....راز









و
شه ....

ۆ
گـ.....زه

وو
ژ...ر

ی
مراو....









ێ
د ....



## ڕاهێنان ( ٢ )

**تکایە، سەیری ئەم وێنانەی لای خوارەوە بکەو بە دەنگ ناوەکانیان دەربببڕە، پاشان بە پیتێکی گونجاو وشەکان تەواو بکە:**

پ پـ



تۆ....

ب بـ



کەبا....

ت تـ



لوو....



....ـێ



.....ەرد



....رێ

ن نـ

ژ....



س سـ

دا....



ش شـ

دارتا....



......ۆ ٩

ما...ی



...یر



ل لـ

مه....

ڵ ڵـ

گو....

ک کـ

نۆ....

خ خـ

بەر....



چ چـ

ور....



ف فـ

تەنا...



...ورما



...او



.....ڕۆکە



ق قـ

بۆ...



ڤ ڤـ

مرۆ....



ا

نـ.... ن



...از



شـ....ان



د...ر



ی یـ



دەرز..

ێ یێـ



هەرمـ...

هـ



...ەنار



..اری



شـ...ر



بە..ار

ە



هـ...ور

ع عـ



بـا....

غ غـ



با...

م مـ



ڕ...



ز..رد



...ەرەب



...اردان

م مـ



...ۆم

# چالاکی (١)

## ئەم وشانەی خوارەوە بڕگە بڕگە بکە:

وەرە ← وە ... رە

زۆزان ← زۆ....

نازە ← نا...

نەوزاد ← نەو..

نانەوا ← ... نە...

باران ← با....

مامە ← ... ...

گەڵا ← گە....

گەرما ← ... ...

باوک ← با .....

کەڵەباب ← .... باب

## چالاکی (٢)

### ئەم پیتانەی خوارەوە لێکبدە و وشەی لێدروست بکە:

سـ ، ە ، ر ، د ، ا ، ر = (سەردار)
کـ ، و ، ر ، د ، سـ ، تـ ، ا ، ن = (          )
ئـ ، ا ، ڵـ ، ا = (          )
گـ، ۆ ، ر ، ا ، نـ ، ـی = (          )
سـ ، ر ، وو ، د = (          )
یـ، ا ، ر ، ی = (          )
هـ ، ە ، ڵـ ، پـ ، ە ، ڕ ، کـ ، ێ = (          )
مـ ، ۆ ، سـ ، یـ ، قـ ، ا = (          )
ز ، سـ ، تـ ، ا ، ن = (          )
قـ،و ، تـ ، ا ، بـ ، خـ ، ا ، نـ، ە = (          )
مـ ، ا ، مـ ، ۆ ، سـ ، تـ ، ا = (          )

## چالاکی (٣)

ئەم بڕگانەی خوارەوە لێکبدە و وشەی لێدروست بکە:

دا ، دە = (دادە)
کا ، کە = (          )
خا ، ڵە = (          )
پوو ، ڕێ = (          )
ئا ، رام = (          )

# ئەم مرۆڤانە کار دەکەن



مامۆستا

قوتابی فێر دەکات.



پزیشک

نەخۆش چارە دەکات.



نژیار

دیوار دروستدەکات .



دارتاش

کورسی دروستدەکات .



نانەوا
نان دەبرژێنێت.



جووتیار
زەوی دەکێڵێت .



ئاسنگەر
پەنجەرە دروستدەکات .



گۆشتفرۆش
گۆشت دەفرۆشێت .

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
| --- | --- | --- |
| فێردەکات | : | فێری دەکا |
| پزیشک | : | نۆژدار، بزیشک |
| نەخۆش | : | نەساغ |
| نژیار | : | وەستای دروستکردنی خانوو |
| زەڤی | : | زەوی، ئەرد |
| نانەوا | : | نانپێژ |
| دەبرژێنێ (نان دەکا) | : | دەپێژێت |

# ڕاهێنان

خوێندکاری خۆشەویست، ئەم ڕستانەی خوارەوە تەواو بکە:

١. ................ نان دەبرژێنێت.

٢. ................ پەنجەرە دروستدەکات.

٣. ................ گۆشت دەفرۆشێت.

٤. جووتیار ................ دەکێڵێت.

٥. ................ کورسی دروستدەکات.

٦. پزیشک ................ چارە دەکات.

٧. ................ دیوار دروستدەکات.

٨. مامۆستا خوێندکار ................ دەکات.

# چالاکی (١)

قوتابی خۆشەویست، ئەم مرۆڤانە چ کارەن لە بۆشاییەکاندا بیانووسە:

(شوفێر، سەرتاش، بۆیاغچی، دوکاندار)



١. ئازاد دیوار ڕەنگ دەکات.
ئازاد ............. یە.



٢. کاوە ئوتۆمبێل لێدەخورێ.
کاوە .............. ە.



٣. نەوزاد لە دوکان شت دەفرۆشێ.
نەوزاد .................. ە



٤. کارزان مقەست و شانە بەکاردێنێ.
کارزان ....................... ە

# چالاکی (٢)

خوێندکاری خۆشەویست بڕوانە ئەم وێنانە، لە پاشدا ناوەکانیان لە بۆشاییەکان دابنێ.

١. ..................

٢. ..................

٣. ..................

٤. ..................









# منداڵی ژیر



من منداڵێکی ژیرم. قوتابییەکی پاک و زیرەکم. بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستم. ڕۆژباش لە ئەندامانی خێزانەکەم دەکەم. بە ئاووسابون دەست و دەم و چاوم دەشۆم. بە هێمنی نانی بەیانی دەخۆم، ئەوجا جلەکانم دەگۆڕم و جانتاکەم لە شان دەکەم و بەرەو قوتابخانە دەڕۆم. بە بێدەنگی لە پۆل دادەنیشم و گوێ لە مامۆستاکانم دەگرم.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| منداڵ | : | زارۆک |
| ژیر | : | زیرەک |
| پاک | : | پاکژ، خاوێن |
| بەیانی | : | سپێدە |

| | | |
|---|---|---|
| هەڵدەستم | : | ڕادەبم |
| قوتابی | : | خوێندکار |
| هێمنی | : | لەسەرخۆ |
| گوێ | : | گوهـ |
| خواردنی نیوەڕۆ: | | فراقین |
| خواردنی ئێوارە: | | شیڤ |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. قوتابی کەی لە خەو هەڵدەستێ؟

٢. دەبێ چۆن نان بخۆین؟

٣. دەبێ لەناو پۆل چی بکەین؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە پڕ بکەوە:

١. بەیانیان زوو ............... هەڵدەستم.

٢. بە ............... دەست و دەم و چاوم دەشۆم.

٣. گوێ لە ................ دەگرم.

## چالاکی (١)

مامۆستا دەپرسێت:

- تۆ لە خوێندنگە چۆن ڕۆژباش لە مامۆستا و هاوڕێکانت دەکەیت؟
- قوتابی خۆشەویست، باسی ئەوەمان بۆ بکە، کە تۆ لەنێوان پشووی وانەکانتدا چی دەکەیت؟

# چالاکی (٢)

خوێندکاری خۆشەویست:

هەوڵبدە کاتەکانی ئەم کاتژمێرانەی خوارەوە بخوێنیتەوە:












# مۆسیقا

مۆسیقا ئەو دەنگ و ئاوازە خۆشانەیە، کە لەگەڵ گۆرانی و شایی و هەڵپەرکێ و بۆنەکان لێدەدرێت، لە ئامێرەکانی مۆسیقاوە دەردەچێت و هەستی مرۆڤ دەجووڵێنێ، خۆشی و شادی دەخاتە دڵی مرۆڤەوە و بەختیار و دڵخۆشی دەکات.

## چەند ئامێرێکی مۆسیقا

١. پێستەییەکان:

دەف


تەپڵ


دەهۆڵ


٢. ژێـــدارەکان:

کەمانچە


عود


گیتار


٣. فووداره‌کان:

زورنا


شمشاڵ


باڵەبان




## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| گۆرانی | : | ستران |
| هەڵپەڕکێ | : | گۆڤەند |
| کات | : | دەم، گاف |
| زەماوەند | : | شاهی |
| بە تەنیا | : | بتنێ |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. دەف و تەپڵ بەچی لێدەدرێن؟

٢. شمشاڵ بە چی لێدەدرێت؟

## چالاکی

قوتابی ژیر، بە یەکێک لە وشەکانی ناو لاکێشەکەی لای خوارەوە ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

١. ............... لەگەڵ گۆرانی لێدەدرێت.

٢. ............... ئامێرێکی ژێدارە.

٣. مۆسیقا ............... دەخاتە دڵی مرۆڤەوە.

٤. ............... ئامێرێکی فووداره.

**گیتار، شمشاڵ، مۆسیقا، خۆشی**

# قوتابخانه




قوتابخانه زۆر خۆشـه
مەڵبەندی بیر و هۆشه
دەیـپـارێزم باخچەکـــــــــەی
دەرگا و شووشه و پەنـــــجەرەی
قوتابخانه گشت کاتێ
ڕووناکیمان دەداتـــێ
فێرمان دەکا وریابـــــین
بۆ تەنـگانه ئازابـــــین
قوتابخانه زۆر خۆشـه
مەڵبەندی بیر و هۆشـه.

(لەتیف هەڵمەت)

## واتای وشەکان

| وشه | | واتا |
|---|---|---|
| مەڵبەند | : | بنکه |
| گشت | : | هەموو |
| سات | : | کات |
| وریا | : | هۆشیار |
| تەنگانه | : | تەنگاقی |
| قوتابخانه | : | خوێندنگه |

## ڕاهێنان

خوێندکاری خۆشەویست، ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:



١. قوتابخانە زۆر ................ مەڵبەندی ................

٢. دەیپارێزم ................ دەرگا و شووشە و.................

٣. قوتابخانە گشت کاتێ. ............... دەداتێ.

## چالاکی (١)

خوێندکاری خۆشەویست، سێ جار ئەم ڕستانەی لای خوارەوە لە تێنووسەکەت بنووسەوە:

(قوتابخانە وەکو ماڵ وایە، دەبێ پارێزگاری بکەین و مامۆستاکانمان خۆش بوێ).

## چالاکی (٢)

(قوتابخانە ڕووناکییە، زانست چرایە، مامۆستا هاوڕێیە)

ئەم ڕستانەی سەرەوە چوار جار لە تێنووسەکەت بنووسەوە، پاشان لەگەڵ مامۆستاکەتدا گفتوگۆیان لەسەر بکە.



# پیاوێکی نابینا



بەیانی زوو بوو. شێرکۆ بۆ قوتابخانە دەچوو. پیاوێکی نابینای بینی، کەس نەبوو دەستی بگرێت و لە شەقامەکە دەربازی بکات، شێرکۆی دلۆڤان دەستی گرت و بە هێمنی پەڕاندییەوە. پیاوە نابیناکە زۆر سوپاسی شێرکۆی دلۆڤانی کرد، چونکە یارمەتی دا.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| بەیانی | : | سپێدە |
| پیاو | : | مێر |
| نابینا | : | کۆرە، کوێر |
| شەقام | : | جادە |
| دلۆڤان | : | بە بەزەیی |
| هێمنی | : | هێدی، لەسەرخۆ |
| پەڕاندییەوە | : | دەرباز کردییە |

یارمەتی دا : هاریکاری کر
دەتوانـــێ : دشێت

## ڕاهێنان

قوتابیی خۆشەویست، ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە پڕ بکەوە:

١. شێرکۆ بۆ ................ دەچوو.
٢. شێرکۆ پیاوێکی ................ دی.
٣. شێرکۆ پیاوە نابیناکەی لە ................ دەربازکرد.
٤. پیاوە نابیناکە زۆر ................ شێرکۆی ................ کرد.

## چالاکی (١)

- ئایا نابینا دەتوانێت بخوێنێتەوە؟ خوێندکاری خۆشەویست، ئەم پرسیارە لە مامۆستاکەت بکە*
- هەر خوێندکارێک باسی هاوکاریی کەسێکی (کەمئەندام) بکا، کە یارمەتیداوە (گێڕانەوەی باسێک).



* نابینا دەخوێنێتەوە بەڵام بە ڕێگای ( برایل )

# چالاکی (٢)

بینا          نابینا

تۆش ئەم وشانەی خوارەوە وەکو نموونەکەی سەرەوە لێبکە:

ڕەوا

................

دیار

................

ڕێک

................

ڕەسەن

................

پەسەند

................

خۆش

................



# ئاواتی منداڵان



ئێمە منداڵی جوانین، نەوەی داهاتووین. زۆر حەزمان لە خوێندنە، لە ژیان و پێشکەوتنە. دەبێ چاودێریمان بکەن. مافەکانمان دابین بکەن. گوێمان لێبگرن. ڕامان وەربگرن. ئازادبین لە هاتوچۆ، لەخوێندن و گفتوگۆ. پێویستە قوتابخانە و نەخۆشخانەمان هەبێت، بە زمانی خۆمان بدوێین و بخوێنین. نابێ کاری گرانمان پێبکەن. دەبێ بێ جیاوازی ئایین و زمان، بە تەبایی لە وڵاتی خۆماندا بژین.

## واتای وشەکان:



| وشە | | واتا |
| --- | --- | --- |
| ئاوات | : | هیڤی، ئارمانج |
| داهاتوو | : | ئایندە |
| پێشکەوتن | : | پێشکەفتن |
| چاودێری | : | چاڤدێری |
| دابین بکەن | : | مسۆگەر بکەن |
| گوێمان لێ بگرن | : | گوهێ خۆ بدەنە مە |
| رامان وەربگرن | : | گوێ لە بیرو بۆچوونمان بگرن. |
| جیاوازی | : | جودایی |
| ئایندە | : | دوا رۆژ |

## راهێنان

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. منداڵان حەزیان لە چییە؟

منداڵان حەزیان لە ..................، لە .................و

....................

٢. لە قوتابخانە فێری چی دەبین؟ (نووسین و خوێندنەوە)

لە قوتابخانە فێری .................. و .................. دەبین.

٣. سوودی نەخۆشخانە چییە؟ ( چاک )

لە نەخۆشخانە نەخۆش .................. دەبێتەوە.

## چالاکی (١)

- با ماموٚستا باسی (ئەرک و ماف) بوٚ قوتابییان بکا.
- با قوتابییان باسی داهاتووی خوٚیان بکەن، حەز دەکەن لە ئایندەدا ببن بەچی؟
- با قوتابییان (بە یارمەتی ماموٚستاکەیان) ئەرکی قوتابخانە و نەخوٚشخانە باس بکەن.

## چالاکی (٢)

ژمارەی ڕاست و هەڵەی ئەم ڕستانەی خوارەوە لە خشتەکەدا بنووسە:

١. ئێمەی منداڵ حەز لە خوێندن ناکەین.
٢. پێویستە منداڵان خوێندنگە و نەخوٚشخانەیان هەبێت.
٣. نابێ کاری گران بە منداڵان بکەین.
٤. گوێ لە منداڵان ناگرین.
٥. هەموو منداڵێک پێویستە بە زمانی خوٚی بخوێنێت.
٦. دەبێ قوتابی بە قسەی ماموٚستا بکات.

| ڕاست | هەڵە |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |

## چالاکی (٣)

( هونەری منالآن نەخشی سەربەردان.)
بە خەتێکی جوان دووجار ئەو دێرە لە تێنووسەکەتدا بنووسەوە.

# دۆستی یاسام



من قوتابییەکی وریـــام
هەمیشە دۆستی یاســام
ڕەوشتم بەرز و پــاکـــــە
ڕەوت و کردەوەم چاکـــە
لە هەر شوێنێک یاسا بێ
لای من سەرپێچی نابـــێ
مامۆستا جێی سوپاســە
ئەو بۆی کردم ئەم باسە
پێشکەوتن بە یاسایـــە
سوودی هەمووانی تیایــە

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| هەمیشە | : | هەمووکاتێ، هەموو گاڤێ |
| ڕەوت | : | ڕێگا |
| سوود | : | قازانج، کەڵک |

# ڕەوشتی سەردان



سەردان ڕەوشتێکی جوانە، مرۆڤ پێی خۆشەویست دەبێت.

مامۆستا لە قوتابییانی پرسی: شێوازی سەردان چۆنە؟

قوتابییەک: دەبێت ئاگاداری ئەو کەسانە بکەینەوە کە دەمانەوێت سەردانیان بکەین.

قوتابییەکی دیکە: کاتی سەردانەکە دیاریبکەین.

قوتابییەکی دیکە: خۆمان ڕێکوپێک بکەین.

قوتابییەکی دیکە: لە دەرگای ماڵەکەیان بدەین و سڵاویان لێ بکەین و لە تەندروستییان بپرسین.

قوتابییەکی دیکە: پێویستە زۆر نەئاخڤین و زۆریش نەمێنینەوە بۆ ئەوەی بێزاریان نەکەین.

## واتای وشەکان



| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| خۆشەویست | : | خۆشتڤی |
| تەندروستی | : | لەشساغی، ساخلەمی |
| ئاخاڤتن | : | قسەکردن |
| بێزار | : | هەراسان. |

## ڕاهێنان

خوێندکاری خۆشەویست ئەم بۆشاییانە بە وشەیەکی گونجاو پڕ بکەوە.

١. سەردان ڕەوشتێکی ..................

٢. شێوازی ................ چۆنە؟

٣. پێش ئەوەی بچینە ژووریٚ دەبێت لە ................ بدەین.

٤. دەبێت کاتی سەردان ..................

## چالاکی (١)

مامۆستای هێژا:

١. ڕەوشتی سەردان بۆ قوتابییان ڕوون بکەوە؟

٢. کە دەچێتە سەردانی ماڵە دراوسێیەکیان چۆن سڵاو لەوان دەکات هەواڵی لەش ساغیان دەپرسیٚ.

# چالاکی (٢)

قوتابی خۆشەویست: سەیری ئەو وێنانە بکەو ناوەکانیان لەژێر بنووسە.



...................



................



................



..................



................



...............

# چالاکی (٣)

ئەم ژمارانە بە یەکتری بگەیەنە و بزانە چ وێنەیەکی لێدەردەچێت و وێنەکە ڕەنگ بکە.











**لەمین نزیک مەبەوە، دەستکاری مـــەکە**
**هیچ شتێکی تێ مەگرە، چونکە کوشندەیە**









**تەقەمەنییەکان مەترسیدارن.**
**لێیان نزیک مەبەوە،**
**هەوڵی دەستکاریکردنیان مەدە.**





**ئەم هێمایانەی سەرەوە نیشانەی بوونی مین و تەقەمەنین.**
**لێیان نزیک مەبەوە!**






**هەرگیز لەم ناوچە مەترسیدارانە نزیک مەبەوە!**

# کوردستان



کوردستانم شیرینـــــــه
زۆر دڵگیر و ڕەنگیـــــنە

شاخی بڵند و جوانـــــە
پڕ کانی و دارستانـــــە

بەهاران لە گـــشت لاوە
سەوزەگیا و گوڵ و ئاوە

شوێنی سەیران و گەشتە
بەڕاستی وەک بەهـەشتـە

(کازم کۆیی)

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| دڵگیر | : | دڵڕەفێن |
| شاخ | : | چیا |
| گشت | : | هەموو |

## راهێنان

قوتابیی خۆشەویست، ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە پڕ بکەرەوە؟

١. کوردستانـم .................

٢. شوێنی سەیران و ............... بەڕاستی وەک

....................

٣.  شاخی ....................

## چالاکی

با مامۆستا نەخشەی کوردستان و ئاڵای کوردستان پیشانی قوتابییان بدات.





# گـــــــوند



گوند له شار و شارۆچکه بچووکتره. خانوو دانیشتوانی کەمن. ئاووهەوای گوند خۆش و سازگاره، خەڵکی مەڕومالآت و پەلەوەر بەخێو دەکەن و ڕەزو باخی میوەیان هەیە. گەنم و جۆ و نیسک و نۆک دەچێنن. ژیانی گوندان زۆر سادەو ساکار و خۆشە. خەڵکی گوندەکان کاروبارەکانیان بە هەرەوەز ئەنجامدەدەن. پێویستە هەوڵبدرێت گوندەکانی کوردستان ئاوەدان بکرێنەوە، بۆ ئەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری زۆربێت.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| شارۆچکە | : | بازێرک |
| شەقام | : | جادە |
| گەرماو | : | گەرماڤ، سەرشۆر |

| | | |
|---|---|---|
| گەورە | : | مەزن |
| مەڕوماڵات | : | پەز و بزن |
| پەلەوەر | : | باڵندە |
| ساکار | : | ئاسان، سانا |
| هەرەوەز | : | هاریکاری، زبارە |

## ڕاهێنان

ئەم وشانە بخوێنەوە و پاشان لە تێنووسەکەت دووجار بیاننووسەوە:

(شارۆچکە، گوند، نیسک، ساوار، ئاوەدان، هەرەوەز، مەڕوماڵات، بازاڕ، خانوو).

## چالاکی (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. گوند و شار بەچی لێک جیا دەکرێنەوە؟

٢. ئەمانەی خوارەوە لە کامەیاندا هەیە و لە کامەیاندا نییە؟

(شەقامی گەورە، نەخۆشخانەی گەورە، گەرماو، مەڕوماڵات، ڕەزوباخ، چاندنی گەنم و جۆ).

## چالاکی (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١.خەڵکی گوند ............. دەچێنن.

( ماست و شیر، گەنم و جۆ، بەرد و ئاسن )

٢.گوند خانوو و دانیشتوانی ............. .

( کەمن، زۆرن، نین )

٣.خەڵکی گوندەکان ئیشەکانیان بە ............. دەکەن.

( سستی، هەرەوەز، تەنها )

# ئـــــــالآمان



ئالآمان شەكاوەیــــــــە
قەشەنگ و ڕازاوەیـــــــە
چوار ڕەنگی جوان و گەشە
هی خاکێکی چوار بەشـــە
سپی و زەرد، سەوز و سوورە
هیـــوای نـزیـــــک و دوورە
زەردی ڕۆژی ڕووناکــــــە
سپیی ئاشتییە و پـــــاکە
سەوزی هێمای ژیـانـــە
سوور خوێنی شەهیدانـــە
با هەموومان یەکدەنگ بین
یەک گوتار و یەکڕەنگ بین
یەک بخەین تەقـەلامــــان
تا هەر وابـێ ئـالآمــــان
هەر جوان و گەشـــاوە بێ
بەرزبێ، شـەکـاوە بـــێ

( موحسین حەمەد ئەمین زینەددین )



## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| قەشەنگ | : | جوان، ڕازاوە |
| سەوز | : | کەسک |
| تەقەلا | : | هەوڵ و کۆشش |

## ڕاهێنان

خوێندکاری خۆشەویست، وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. تۆ لە کوێ دەژیت؟

٢. ئاڵای کوردستان چەند ڕەنگە؟



## چالاکی

قوتابی خۆشەویست

١. ئەمە ئاڵای کوردستانە،

ئەم ئاڵایە چوار ڕەنگە،

١. سوور ٢. سپی ٣. سەوز (کەسک) ٤. زەرد

ئێستا تۆ ئاڵای کوردستانم بۆ ڕەنگ بکە.

٢. من دەخوێنم، تاکو لە داهاتوو بتوانم، خزمەتی گەل و نیشتمانەکەم بکەم.

ئەم ڕستەیەی سەرەوە سێ جار لە تێنووسەکەت بنووسە.

# جوانكاری شارو گەڕەک



هوشیار منداڵەکی ژیر و جوانکیلەبوو، لە پۆلی دووەمی بنەڕەتی بـــوو، ڕۆژێک کە لـــە قوتابخانە دەهاتەوە، دیتـــی کۆمەڵە کرێکارێک لە کەناری شەقام و شوێنە تایبەتییەکاندا دارو درەخت و نەمام دەڕوێنن و گوڵ دەچێنن تا شارەکەی پێ جوان بێت و گەڕەک و شەقامەکان پاک و خاوێن و ڕازاوە بن. هوشیار بە پەلە چووە ماڵ و ئەم هەواڵەی بۆ باوکی باسکرد، باوکیشی گوتی:

کوڕەکەم ئـــەوە ئەوان دەچێنن، مەرج ئەوەیە ئێـــوەی منداڵیش نەیان شکێننەوە و هەڵیان نەکێشن و ئاگاداریانبن تا پێـــــــدەگەن.

هوشـــیار: بابە گیان، سۆز و بەڵێن بێت بە خۆم کاری وا نابەجێ نەکەم و ڕێگەبە هەڤاڵەکانیشـــم نـــادەم کاری وا بکەن. چونکە ئێمە هەموومان شارەکەمان خۆش دەوێت و حەز بە جوانی و ڕێکی دەکەین.

# واتای وشەکان



| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| گەڕەک | : | ڕەندەک، تاخ |
| ژیر | : | هۆشمەند |
| جوانکیلە | : | خشکۆک |
| کەنار | : | قەراخ |
| ڕازاوە | : | خەملای |
| خۆ بنوێنن | : | خۆ نیشانبدەن |
| بە پەلە | : | بلەز |
| پێدەگەن | : | گەورە دەبن، گەشە دەکەن |
| نابەجێ | : | نارێک |

## ڕاهێنان

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. کرێکارەکان ................. دەچێنن.

٢. ئاگاداریان بکەن تا ................. .

٣. کاری ................. ناکەم.

٤. هەموومان ................. خۆشدەوێت.

## چالاکی (١)

قوتابی ژیر:

١. ناوی سێ گوڵ بنووسە:

.................، .................، .................

٢. ناوی دوو درەخت بنووسە:

.................، .................

٣. ناوی سێ شاری کوردستان بنووسە:

.................، .................، .................

## چالاکی (٢)

ئەمانە لە تێنووسەکەت بنووسەوە:

(گوڵ و ڕێحان، دارودرەخت، گژوگیا، گەنم و جۆ)

# هەموو کار دەکەن



لە کێڵگەی مام زۆراب گایەک، مانگایەک، مراوییەک، مریشکێک و کەڵەشێرێک هەبـــــوون. کەڵەشێرەکە بەیانییان زوو دەچووە سەر بەرزاییەک، بە دەنگی بەرز دەیـخوێند: ققو قوو قوو..

لە خەو هەستن زوو بەزوو.

مراوییەکە دەیوت: غاک.. غاک.. غاک.. با بچین بۆ ناو ئاوی پاک.

مریشکەکە دەیوت: گار.. گار... گار.. هێلکان دەکەین بە بێ ژمار.

جووجەڵە دەیوت: جیو.. جیو.. جیو...

گا دەیوت: جووت.. جووت.. جووت.. با بچین بۆ کێڵگە بە جووت.

مانگاکە دەیوت: دۆش.. دۆش.. دۆش.. کابان تۆش وەرە بمدۆش.



## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| مانگا | : | چێڵ |
| مراوی | : | سۆنە |
| کەڵەشێر | : | کەڵەباب |
| بەرزایی | : | بڵندایی |
| لە خەوهەستن | : | ژخەو ڕابن |
| وت | : | گۆت |
| گار گار | : | دەنگی مریشکە لەکاتی هێلکەکردن. |
| بـمدۆش | : | من بدۆشە |
| کابان | : | کەیبانوو |

## چالاکی

مامۆستای بەڕێز: نەخۆشی ئەنفلەوەنزای باڵندە و خۆ پاراستن لێی بۆ خوێندکاران ڕوون بکەوە.





# مامۆستای دڵسۆز




بڵێن: مامۆستا بژی
بژی، بژی، هەربـژی

هـەر بـژی ئەو چرایـــە
وەک دایک و باوک وایـە
بە ناسکی و بە خەندە
دەڵێ: هیوام بـڵنـــدە

ئێوە هەموو تێبـــگەن
بۆ نیشتمـان پێبـــگەن

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| چرا | : | لالە |
| خەندە | : | بزەی سەر لێو |
| بڵند | : | بەرز |
| پێبگەن | : | بێنە بەرهەم |



# لەشساغی



مامۆستا لە خوێندکارەکانی پرسی
ئەوەی یاریدەی لەشساغیمان دەدات چییە؟
* یەک لە خوێندکارەکان گوتی:
- هەتاو
* یەکێکی دیکە گوتی:
- هەوای پاکو خاوێن.
* خوێندکارێکی دیکە گوتی:
- ئاو
مامۆستاکە گوتی:
- ئەمانە هەموویان ڕاستن
بەڵام گەلێک شتی باشی دیکە هەنە وەک:
- ددان شۆردن و پاکو خاوێنی...
زوو نوستن و زوو لەخەو هەستان..
خۆ پاراستن لە نەخۆشی. ئەمانەش زۆر پێویستن.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| هەتاو | خۆر، ڕۆژ |
| ددان شۆردن | ددان شوشتن |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. مامۆستاکە چی لە قوتابییەکانی پرسی؟

٢. قوتابییەکان هەر یەکە لە وەڵامدا چییان گوت؟

٣. مامۆستاکە چی دی بۆ لەشساغی بە باش زانی؟

## ڕاهێنان (٢)

وانەکە بە باشی بخوێنەوە ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی لەبار پڕ بکەوە:

ئەوەی یاریدەی لەشساغیمان دەدات، ددان...............،...........

... نووستن، زوو لە...............، ................. خۆ پاراستن لە.................

## چالاکی

مامۆستای بەڕێز: خوێندکارێ هەڵبستێنە پرسیاری لێبکە، لەم باسەی خوێندمان چی فێربوویت؟

# ڕێزگرتن لە کات



نارین و سەفین دوو خوێندکاری زیرەکـــــــن، کاتی خۆیـــان دابەشکـردووە، بەیانیان دەچنە خوێندنگـــــــە، نیوەڕۆیان پاش نان خواردن لەمـالّـەوە هـــاوکاری دایــک و باوکیــان دەکەن، ئێواران وانەکانی ڕۆژی دواتر ئامادە دەکەن، شەویش دەخوێنن. زوو دەنوون و زوو لە خەو هەڵدەستن، نارین و سەفین لەلای دایک و باوکیان خۆشەویستن، بۆیە بێ دڵیان ناکەن.

## ڕاهێنان ( ١ )

قوتابی خۆشەویست ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

١. نارین و سەفین ................ خۆیان دابەشکردووە.

٢. بەیانیان دەچنە ................

٣. ئێواران ............... ڕۆژی دواتر ئامادە دەکەن.

٤. ................ دەنوون و زوو لە ................ هەڵدەستن .

## ڕاهێنان (٢)

قوتابی خۆشەویست ئەم پەندەی خوارەوە لەتێنووسەکەت بنووسەوە:
( کات وەک زێڕ وایە نابێ لە دەستی بدەیت).

## چالاکی

شەو : شەڤ

قوتابیی خۆشەویست تۆش ئەم وشانەی خوارەوە وەک نموونەکەی سەرەوە لێبکە.



چاو: .................

لێو: .................

ئاو: .................

سێو: .................

ناو: .................

میوان: .................

# خێزانێکی بەختەوەر



شیرین و فەرهاد هاوسەربوون، یەکدییان خۆشدەویست، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکدی و منداڵەکانیاندا زۆر باشبوو. کەس ستەمی لە کەس نەدەکرد. هەموویان تەبابوون و نێوانیان خۆشبوو، هیچ ناخۆشی و دووبەرەکییەک لە نێوانیاندا نەبوو، لەهەموو کارێکدا پرسیان بە یەکدی دەکرد. بۆیە هەموو خەڵک خۆزگەی پێ دەبردن.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| بەختەوەر | : | ئاسوودە |
| هاوسەر | : | ژن و مێرد |
| تەبا | : | نێوان خۆشی |
| ستەم | : | زۆرداری |
| دووبەرەکی | : | ناکۆکی |

## ڕاهێنان

خوێندکاری خۆشەویست، ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١.شیرین و فەرهاد ................ بوون.

٢.هەڵسوکەوتیان لەگەڵ منداڵەکانیان زۆر ................ بوو.

٣. هەموو خەڵک ................ پێی دەبردن.

## چالاکی (١)

مامۆستا باسی خێزانی بەختەوەر و خێزانی ناکۆک بکات و ئەنجامی هەڵسوکەوتی هەر یەک لەوان بۆ خوێندکاران باس بکات.

## چالاکی (٢)

هەر یەکە لەم وشانە بگەینە بەو وشەیەی لەگەڵی دەگونجێت:

| | | |
|---|---|---|
| باپیر | : | برای دایک |
| مەت | : | کچی مام |
| خالەت | : | باوکی دایک یان باوک |
| مام | : | برای باوک |
| خاڵ | : | کوڕ یان کچی برا |
| پسمام | : | خوشکی باوک |
| دۆتمام | : | خوشکی دایک |
| برازا | : | کوڕی مام |

# بەرخەکەم



ئەی بەرخۆڵەکـــــــە
نەرم و نۆڵەکــــــــە
سپی و خرپنـــــــی
وەک کولوی لۆکـــــە
دەستەمۆ و چەشـــی
فێرە باوەشـــــــی
دەنگی بارە خـــۆش
جوان و چاو رەشـــی

بۆ هەر کوێیەک چووم
تۆش وەرە لــە دووم
ئەتلەوڕێنــــــــم
هەروەکو بێـــچووم
وەرە خلە خـــــل
بچۆ نەرم و شـــــل
ببارێنە بـــــــاع
بەرخی چاو بەکـــل

(گۆران)

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| کلو | : | پارچەیەکی بچووک |
| چەش | : | تامکردوو |
| هەر کوێیەک | : | هەر جێیەک |
| بێچوو | : | بەچکە |
| خلە خل | : | خلبوونەوە |
| بارە | : | دەنگی بەرخ |
| خرپن | : | قەڵەوی کورت |
| دەستەمۆ | : | لام بوو |



# کەروێشکێکی وریا



جارێکیان ڕێوییەک ویستی کەروێشکێک بخوات. بۆ ئەمەش چووە نزیک لانەکەیەوە، خۆیدا بە زەویدا، هەردوو چاوی نووقاند، دەمی خۆی داخست. چوار پەلی لێراکێشا و خۆی مراند. کە کەروێشکەکە هاتەوە و ڕێویەکەی بەم جۆرە بینی، دڵی خۆش بوو، بەڵام نەیوێرا نزیکی بکەوێتەوە، چونکە لەوە دەترسا فێڵێک بێت و بۆ خواردنی ئەم دانرابێت، لەبەرئەوە بە دەنگی بەرز وتی:

ئەو ڕێوییە هەژارو بەستەزمانە مردووە، بەڵام وەکو بیستوومە، ڕێوی، کە دەمرێ دەمی دادەچەقێنێ و قاچەکانی بۆ سەرەوە بەرز دەکاتەوە، کەچی نازانم بۆچی ئەم ڕێوییە دەمی داخستووە و قاچەکانی لێ درێژ کـــردووە؟

که ڕێوییەکە گوێی لەم قسەیە بوو، دەمی داچەقاند و قاچەکانی هەڵبڕی، ئەوجا کەروێشکەکە بۆی دەرکەوت کە ڕێوییەکە زیندووە، ڕایکرد و تێر تێر پێی پێکەنی.

## واتای وشەکان



| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ویستی | : | خواستی |
| لانە | : | شوێنی حەوانەوەی کەروێشک |
| فێڵ | : | خاپ |
| بەسەرزمان | : | بێدەسەڵات |
| قاچ | : | پێ |
| هەڵبڕی | : | بڵند کر |
| ئەوجا | : | لەدوایدا |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١ - کەروێشکەکە چی گوت؟

٢ - ڕێوییەکە بۆچی چاوی خۆی نووقاندبوو؟

٣ - بۆچی کەروێشکەکە بە ڕێوییەکە پێکەنی؟

٤ - ڕێوییەکە زیندوو بوو یان مردبوو؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانە بخوێنەوەو سێ جار بیاننووسەوە:

ڕاکێشابوو

چاوی نووقاندبوو

مردبوو

زیندووبوو

# ئـــــــاو



ئاو سەرچاوەی ژیانە. ژیان بێ ئاو نابێ. مرۆڤ و گیانلەبەر و ڕووەک بەبێ ئاو ناژین، بۆیە دەبێ ئاو بە فیڕۆ نەدەین، پیسی نەکەین، ئاگامان لە ئاوی کانی و کارێز و جۆگە و ڕوبارەکان بێت.

کوردستانی ئێمە وڵاتێکی بە ئاوە، کە لە بەفرو بارانی زستان و بەهارانییەوە زۆر دەبێت و سەرچاوەکانی پێ دەژیێتەوە.

ئاو لە هەموو کاروبارێکی ڕۆژانەماندا بەکاردێت، بۆیە پێویستە هەموومان زۆر دەست بە ئاوەوە بگرین و لامان پیرۆزبێت، چونکە ئاو بەردەوامی بە ژیانمان دەبەخشێت.

# واتای وشەکان



| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| سەرچاوە | : | ژێدەر |
| بۆیە | : | لەوا |
| دەبا | : | پێویستە (پێدڤیە) |
| دەژیێتەوە | : | ڤەدژیت |
| لامان | : | ل نک مە |
| دەبەخشێ | : | ددەت |

## ڕاهێنان (١)

خوێندکاری خۆشەویست تکایە، ئەم وشانە چوار جار لە تێنووسەکەت بنووسەوە:
(کانی، کارێز، جۆگە، ڕووبار، دەریا، دەریاچە)

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:
١. ناوی سێ سەرچاوەی ئاو بژمێرە؟
٢. سەرچاوەکانی ئاو بەچی دەژیێنەوە؟
٣. پێویستە چۆن ئاو بەکاربهێنین؟

## چالاکی (١)

- مامۆستا چۆنیەتی بارانبارین بۆ قوتابییان ڕوون بکاتەوە.
- مامۆستا لە قوتابییان دەپرسێ چ جۆرە ئاوێک دەخۆینەوە.

## چالاکی (٢)

خوێندکاری زیرەک، وەڵامێکی گونجاو بۆ ئەم ڕستانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

١. ئاوی ............... ناخۆینەوە. (پیس، سازگار، پاک)

٢. ............... بەبێ ئاو ناژی. (بەرد، ئاسن، ڕووەک)

٣. بەفر و باران کانییەکان ............... (وشک دەکەنەوە، دەژێننەوە، تێکدەدەن)

٤. ئاو بە فیڕۆدان کارێکی ............... (باشە، خراپە، ڕێکوپێکە)

## چالاکی (٣)

ئاو ئاودار

برین بریندار

تۆش ئەم وشانەی خوارەوە تەواوبکە:

پارە

خێزان

ناز

دڵ



# بۆ باوکم



خۆشەویستەکەی ژینم
باخـەوان و پـەرژینـم
سـڵاوی زۆر بەتینـم
بۆ تۆ باوکی شیرینم
مایەی شانازی منـی
سۆزی ئاوازی منــی
بـەهرەی بەختیاریمـە
ئەم نامەیەم دیاریمـە
خۆشەویستەکەم بابە
لـە ئێمە دڵنـیابــە
تێدەکۆشین بــێوچان
بۆ سەربەرزی نیشتمان

( جەمال شارباژێری )

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| پەرژین | : | تانۆک |
| تین | : | هێز |
| بێوچان | : | بەردەوام |

# ڕاستگۆیی




ڕاستگۆیی ڕەوشتێکی پیرۆزە، کاری مرۆڤی ڕێزدار و باشە، مرۆڤ پێی سەرفراز و خۆشەویست دەبێت، خەڵک باوەڕی پێ دەکەن. کورد دەڵێت: ڕاستبە بە ڕێگای شێرا بڕۆ. دەبێت ئێمە هەموو کاتێک ڕاستگۆبین و خۆمان لە درۆ دووربگرین. بۆ ئەوەی دایک و باوک و خوشک و برا و مامۆستا و هاوڕێکانمان باوەڕمان پێ بکەن و هاوکاریمان بکەن.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ڕێزدار | : | بەڕێز |
| سەرفراز | : | سەربڵند |

# ڕاهێنان

قوتابی خۆشەویست ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. ڕاستگۆیی ............. پیرۆزە.
٢. مرۆڤی ڕاستگۆ ............. و ...............
٣. مرۆڤ بە ............. خۆشەویست دەبێت.
٤. هیچ جارێک ............. نەکەین.
٥. پێویستە خۆمان لە ............. دوور بگرین.

## چالاکی (١)

مامۆستا سوودی ڕاستگۆیی و زیانی درۆکردن بۆ خوێندکاران ڕوونبکاتەوە.

## چالاکی (٢)

قوتابی خۆشەویست هێمای ( ✓ ) یان ( X ) بۆ ئەمانەی خوارەوە دابنێ:

١. باوک و باپیرانمان ڕاستگۆییان کردبوو بە ئارمانجیان.
٢. ڕاستگۆیی ڕەوشتێکی باشە.
٣. پێویستە مرۆڤ لەکردار و گفتوگۆ ڕاستگۆ بێت.
٤. درۆکردن مرۆڤ سەرفراز دەکات.
٥. قوتابیی ڕاستگۆ خۆشەویستە.

| ڕاست | هەڵە |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |

## چالاکی (٣)

ڕێنووس و خۆشنووسی:

(سەرکەوتن هەر لە ڕاستگۆییدایە)

# گفتوگۆی گەنم و برنج



گەنم: من گەنمم، گرنگترین بەرهەمی جیهانم، خواردنی سەرەکی دەوڵەمەند و هەژارانم.

برنج: من برنجم، خواردنی بەچێژی خەڵکم، هەژارو دەوڵەمەند حەز دەکەن بمخۆن.

گەنم: بێجگە لە نان، گەلێک خواردنی دیکەم لێدروست دەکرێ، وەک ساوار، گەنمە کوتا و هەرشتە.

برنج: منیش، پلاو و قبولێم لێدروست دەکرێت.

گەنم: من زۆر پێویستیم بە ئاو نییە، بە ئاوی باران تێر دەبم و گەورە دەبم.

برنج: من زۆر حەزم لە ئاوە، بۆیە لەناوچە زەلکاو و ئاودارەکان دەچێندرێم.

گەنم: من چەند جۆرێکم هەیە، لە کوردستانیشدا لە وەرزی پاییز دا دەچێندرێم. برنج: منیش زۆر جۆرم هەیە، لە ماوەی ساڵێک چەند جارێک دەمچێنن.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| وتووێژ | : | گفتوگۆ |
| بەچێژ | : | بەتام |
| بێجگە | : | ژبلی، جگە |
| گەنمەکوتا | : | دانهێرک |
| پڵاو | : | پلاڤ |
| پێویست | : | پێتڤی |
| گەورەدەبم | : | مەزن دبم |
| ناوچە | : | دەڤەر |

## ڕاهێنان

خوێندکاری خۆشەویست، ئەم بۆشاییانە بەم وشانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

(ساوار، گەنمەکوتاو، برنج، ئاودار، گرنگترین، ئاو)

١. من گەنمم ................ بەرهەمی جیهانم.
٢. ئاردو ............ و ............ لە بەروبوومی گەنمن.
٣. برنج زۆر پێویستی بە ................ هەیە.
٤................ لە ماوەی ساڵێکدا چەند جارێک دەچێنرێت.
٥. برنج لە ناوچەی ................ دەچێندرێت.

## چالاکی (١)

ئەم ڕستەیە لە تێنووسەکەت بنووسەوە:
(گەنم خۆراکێکی سەرەکی مرۆڤە، بۆیە پێویستە زۆر ڕێز لە نان بگیرێت).

## چالاکی (٢)

خوێندکاری خۆشەویست:
ئەم وشانە بخوێنەوە، ئەو شتەی، کە بۆ خواردن دەشێت، ناوەکەی لەناو ئەو خانانەی خوارەوە بنووسە:
( سێو، پەنجەرە، گێزەر، ئاگر، هەرمێ، کراس، برنج، ساوار، ترێ، زەیتون، دیوار، دەرگا، نان، ماسی، پێنووس، پیاز )

| | |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |

# تۆپتۆپێن



ئەی تۆپەکە! فتــبۆڵەکـــــە!
من دێم، لە دەستم ڕامــــەکە
تۆ، تـۆپـی یـاریـکـــــــــردنی
وەک کوولەکەی ڕۆحی منــی
وەختێ کــە چوویتە ئاسمان
بانگ کە لەگەڵ من یەک زوبـان
خۆشبێت وەتەن، خۆشبێت وەتەن
بەرزبێت وەتەن، بـەعیـلم و فـــەن

(زێـــوەر)

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ڕامەکە | : | هەڵمەیێ |
| کوولەکە | : | گیان |
| زوبان | : | زمان |
| وەتەن | : | نیشتمان |
| عیلم | : | زانست |
| فەن | : | هونەر |

# جەژنی منداڵان



هەموو ساڵێک لە یەکی مانگی حوزەیران منداڵان لە سەرانسەری جیهان بە بۆنەی جەژنی منداڵانەوە ئاهەنگ دەگێڕن، چونکە لەم ڕۆژە بڕیار دراوە، مافی منداڵان پارێزراو بێت و منداڵان لە برسییەتی و نەخۆشی و نەخوێندەواری و ماندوویەتی رزگار بکرێن.

هەموو ساڵێک لەم بۆنەیە، باوکی ئازاد و پەروین دیاریی جوان پێشکەش بە منداڵەکانی دەکات، ئەوانیش سوپاسی دەکەن.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| هەموو | : | گشت |
| سالێك | : | سالەك |
| مانگ | : | هەیڤ |
| منداڵ | : | زارۆک |
| سەرانسەر | : | سەرتاسەر |
| چونکە | : | چونکی |
| لەم ڕۆژە | : | دڤێ ڕۆژێ |
| بۆنە | : | بۆنە، هەلکەفت |

## ڕاهێنان

خوێندکاری خۆشەویست، ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

١. هەموو ساڵێک لە ............... منداڵان لە سەرانسەری جیهان ئاهەنگدەگێڕن.

٢. چونکە لەم ڕۆژەدا بڕیاردراوە ............... منداڵ پارێزراوبێت.

٣. بڕیارە، کە منداڵان لە برسییەتی و ...............و ............... و ماندوویەتی ڕزگاربکرێن.

## چالاکی (١)

قوتابیی خۆشەویست، هەوڵبدە لەگەڵ مامۆستاکەت دەربارەی مافی منداڵان بئاخڤیت.

## چالاكی (٢)

ئەم ڕستانەی لە خوارەوە نووسراون ڕاستن یان هەڵەن؟
ژمارەی ڕستەكان لە چوارگۆشەكاندا بنووسە.

١. منداڵان مافی ئەوەیان هەیە، كە بخوێنن.
٢. منداڵان لە یەكی مانگی حوزەیراندا بە شەڕ دێن.
٣. نابێت منداڵ لە خواردن بێبەش بكەین و برسی بكەین.
٤. ئەگەر منداڵ نەخۆشبوو، مافی نییە چارەسەر بكرێت.
٥. دەبێت منداڵ ماندوو بكەین.

| ڕاست | هەڵە |
| --- | --- |
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |

# پێرست